## پێشەکی(وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

...سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێزی بۆ ئەم ئاینە بەرزکردوەتەوە بە باشترین لە زانایان، وە ڕێز و بەخشش خۆی بۆ تایبەت کردوون،وە چوونە ژورەوەی ناو باخچەی پیرۆزی و سوپاسگوازی پێ بەخشیون، بەڕاستی ئەوانن خاوەن حەق و میراتگری پێغەمبەرانن، وە سوودیان پێ گەیاندین و بەرزکراینەوە بە زانستەکانیان و هەموو پیاو چاکان و دۆستەکانیانەوە. پێیان شارەزا بووین و پێیان ڕێزدارکراین ، ئەوانن نزیکەکانی الله و باشترین دۆستی ئەون. ڕێنمایی کردین بۆ ڕێگای پاکترین لە پاکەکان سوپاسگوزاری الله م بە سوپاسێک کەوا نەژمێردرێ لە چاکەی بەخشش و جوانی ، بە بەردەوامی وەستاندنی زەوی و ئەستێرەکان لە ژێر ئاسمانەکەیدا.. وە بە بەردەوامی بەندەیەک کە بپلێتەوە لە نێوان ترسی لە سزات و داواکاری پاداشتت.. وە شاهیدی دەدەم کە هیچ خوایەک نییە بە حەق شایستەی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت تاکە و بێ هاوەڵە ، شاهیدییەک بەپێی مەزنی و گەوەیی خۆی.. وە شاهیدی دەدەم کەوا پێشەوامان خۆشەویستمان محمد بەندە و پێغەمبەری ئەوە، (صلى الله عليه وسلم)

**أما بَعد:**

ئەم کاتێبە کە دارِشتووی:
.محمدی کوڕی عبدالوهاب (شيخ الإسلام) رحمه الله. باس لە چەند واجبێکی پێویست دەکات کە پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك چ پیاوو ئافرەت بیزانن و بیناسن ، بەڵکو کاری پێ بکەن ، گرنگیەکی زۆری پێداوە لەم کتێبە و خودای گەورە ئەو علمەی کە پێی بەخشیوە توانیویەتی بەڵگەی بۆ هەموو ئەو بابەتانەی هێناوەتەوە لە قورئان و سوونەت بۆیە بە پێویستمان زانی کە وەری بگێڕینە،زمانی کوردی بۆ ئاسانکاریەک بۆ مسولمانان ، تا زیاتر شارەزا بین لە ئاینمان و ووریا بین توشی فیتنەو لەرێ لادان نەبیبەوە لە دینی پاکی محمد (صلى الله عليه وسلم) بەو شێوەی ئەو پێی گەیاندوین و لەسەر سوونەتی ئەو بژین و بەرنامەو کاروباری ژیانمان پەیرەو بکەین بە پێی قورئان و سوونەت .
داوا کارم لە الله تعالى ئیخلاص و ڕاستگۆییمان پێ ببەخشێ و زیاتر ئاشنامان بکاتو ووریا بینەوە ، وە تەنها داوامان رەزا بوونی خوایە. و پاداشتی بێ پایانی هاوکاران لە وەرگێڕان و ئامادە کردنی ئەم کتێبە بداتەوە ،

اللهم علِّمنا ما ينفعنا ، وانفعنا ما علمتنا، و زِدنا علماً، اللهم اغفر لنا وللمسلمين ما قدمنا وما اخرنا، و ما اسررنا و ما اعلنا، وما نعلم، وما لا نعلم، وما أنت به أعلم ، اللهم يا مقلب القلوب والأبصار ثبت قلوبنا على دينك ومحبتك و طاعتك، و على اتباع و محبة و طاعة نبيّك مُحَمَّد صلى الله عليه وسلم.

## سێ بنچینەکە:

ئەو سێ بنچینانەی کە پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی پیاوو ئافرەت کە شارەزای ببێت وبیزانن و بیناسی ئەوەش: بەندە پەروەردگاری خۆی بناسێت وە ئاینی خۆی,و پێغەمبەرەکەی محمدﷺ بناسێت:

ئەگەر پێت وترا: پەروەردگاری تۆ کێیە؟
بڵێ: پەروەردگارم اللـه یە، ئەوەی کە پەروەردەی کردووم و پەروەردەی هەموو جیهانیانی کردوە بە ناز ونیعمەتەکانی. وە ئەو پەرەستراوی منە, جگە لەو هیچ پەرەستراوێکی ترم نیە ،

وە ئەگەر پێت وترا :ئاینی تۆ چیە ؟
بڵێ :دین و ئاینم ئیسلامە, ئەوەش خۆدانە دەست خوای پەرەوەدگارو یەك پەرستی و ملکەچ بوونە بۆی و گوێرایەڵی کردنی, دوورە پەرێزی لە هاوبەش بریاردان و خۆ بەری کردن لە ئەهلی شرك.

وە ئەگەر پێت وترا : کێ پێغەمبەرتە؟
بڵێ: موحەمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی عبدالمطلب ي کوڕی هاشم وە هاشمیش لە قورەیشە وە قورەیشیش لە عەرەبە و عەرەبیش لە نەوەکانی ئیسماعیلی کوڕی ابراهیمە.ـ باشترین دروود و سەلامی خوا لەوان بێت و لە پێغەمبەری خۆمان بێت .

## بنچینەی دین و بنەماکانی

بنچینەی دین و بنەماکانی دووانن:
**یەکەم**: فەرمانکردن بە پەرستنی اللـه بە تاک و تەنها و هیچ هاوبەشێکی نیە ، و هاندانیش لەسەر ئەوە ، و خۆشویستن و دۆستایەتی تێیدا، و بەکافر زانینی ئەوەی وازی لێهێناوە.
**دووەم**: ئاگەدارکردنەوە و ترساندنی خەڵک لە هاوبەش بریاردان بۆ خوا ی پەروەردگار لە پەرستنیدا , وە جەختکردنەوە و توندووتیژی تێداکردن, وە دژایەتیکردن و ڕق بوونەوە لەو بابەتەدا، وە کافر کردنی کەسێک کە شیرک ئەنجام بدات.

# مەرجەکانی لا إله إلا الله

**یەکەم:** زانست و زانیاری پێی، بەواتای،
نەفی کردنی پەرستن بە جگە لە الله و جێگیرکردنی پەرستن تەنها بۆ الله.
**دووەم:** دڵنیابوون تیایدا، تەواوی زانیاری بوون تیایدا ، و نەمانی گومان تیایدا.
**سێیەم:** نیاز پاکی و دڵسۆزی (تەنها خودا پێ مەبەست بوون) ، نەمانی هاوبەش پەیداکردن تیایدا.
**چوارەم:** ڕاستگۆیی، نەمانی درۆکردن تیایدا.
**پێنجەم:** خۆشەیستی بۆ ئەو وشەیە، وە خۆشەویستنی بۆ ئەو شتانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەو وشەیە، و دڵخۆش بوون بەوە.
**شەشەم:** ملکەچ بوون بۆ مافەکانی ، ئەوەش کردەوە واجبەکانن ، خواپێ مەبەست بوون و نیاز پاکی ،بۆ دوای ڕەزامەندی خوای پەروەردگار.
**حەوتەم:** قبوڵبوون، نەمانی ڕەتکردنەوە.

### بەڵگەکانی مەرجەکانی لا إله الا الله :

بەڵگەی ئەم مەرجانە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ:-

**بەڵگەی زانست:** الله تعالى دەفەرموێت:
﴿ فَـا اعْلَـمْ أنـّهُ لا إلـه الا اللـه ﴾[1] واتە:- باش بزانە کەوا هیچ پەرستراوێک نییە بە حەق شیاوی پەرستن بێت تەنها الله نەبێ.
﴿ إلَّا مَـنْ شَـهِدَ بِـالحَقِّ وَ هُـمْ يَعْلَمـون﴾[2] واتە:- تەنها ( ئەوانە شەفاعەتیان بەردەکەوێت) کەوا شاهیدی بدا بە حەق . واتە لا اله الاالله وە ئەوان دەشزانن. ئەوەی بە زمان دەریدەبڕن بە دڵ ماناکەی بزانن.
وە بەڵگە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ:- فەرمودەی جێگیرە کە لە . صحیحین . دا هاتووە:
لە عثمان ( رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:
**(** مَـنْ مـاتَ وَ هـوَ يَعْـلَمُ أنـّهُ لا إلـه إلّا اللـه دَخَـلَ الجَنَّـة**)** واتە:- هەرکەسێک بمرێت و لەو کاتەدا بزانێت کەوا هیچ پەرستاوێک نییە بە حەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله، ئەوە دەچێتە بەهەشت.

**بەڵگەی دڵنیابوون:-** الله تعالى دەفەرموێ:
﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴾ [3] واتە:-بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کەباوەڕیان بەخواو پێغەمبەری خوا هێناوە و پاشان نەکەوتوونەتەهیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بەخۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێکۆشاون لەپێناوی ئاینی خوادا، تەنها ئا ئەوانەراستن.

خوای پەروەردگار لەو ئایەتەدا بۆ ڕاستگۆیی ئیمانەکەیان بە اللە و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە مەرجی گرتووە کەوا هیچ گومانێک یان هیچ شکێک لە باوەڕەکەیان نەبێت، وە هەرکەسێک گومان لە ئیمانەکەی هەبێت و دڵنیایی نەبێت ئەوا کەسێکی دوڕووە.
بەڵگە لە سوننەتدا ، فەرموودەی جێگیر لە صحیحدا کە ابي هُرَيرة رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:
( أشهَدُ أنْ لا إله إلّا اللهُ وَ أنّي رَسولُ الله ، لا يَلقِى اللهَ بِهما عَبْدٌ غَيرُ شاكٍ فِهِما، إلّا دَخَلَ الجَنَّة) واتە:- شاهیدی دەدەم و دانی پێدادەنێم کە هیچ خودایەک نییە شایانی پەرستن بێت بە حەق جگە لە اللە وە منیش پەیامبەر خودام، کەسێک بگاتە دیداری اللە بەو دوانەوە و هیچ گومانی نەبێت لەو دوانە ، ئیلا دەچێتە بەهەشت.
وە لە گێڕانەوەیەکی تردا:- ( لا يَلقِى اللهَ بِهِما عَبدٌ غَيرُ شاكٍ فيهِما فَيُحجَبَ عَنِ الجَنَّة) واتە: هیچ بەندەیەک نییە کە بگاتەوە بەو دووانە ئیلا لە بەهەشت ڕێگری لێناکرێ.
هەروەها لە ابو هُريرة .رضي الله عنه .وە لە فەرموودەیەکی دورودرێژدا هاتووە دەگێڕێتەوە; پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:
( مَنْ لَقِيتَ مِنْ وَراءِ هذا الحائِطِ يَشْهَدُ أنْ لَا إلَهَ إلّا اللهُ مُستَيْقِناً بِهَا قَلْبِهِ فَبَشِّرهُ بِالجَنَّةِ) واتە: بەهەر مسوڵمانێک گەیشتی لە پشت ئەو دیوارە، کە شاهیدی بدات کە هیچ خودایەک نییە کە شایەنی پەرستن بێت بەحەق جگە لە اللە یەقین ودڵنیایی پێی هەبوو, ئەوا مژدەی بەهەشتیی پێبدە.

**بەڵگەی نیاز پاکی:** الله تعالى دەفەرموێ:
﴿ أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ ﴾[4] واتە: ئاگاداربن: دینی پاك و خاوێن تەنها بۆ خوایە.
وە فەرمویەتی:﴿ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ ﴾[5] واتە: فەرمانیشیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن بە پاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی بن و لابدەن لە هەموو ئاینێکی تر و تەنها پابەندی ئاینی ئیسلام بن.
وە بەڵگە لە سوننەتدافەرموودەیەکی جێگیر لە صحیحدا هاتووە ،أبو هُرَيرة .رضي الله عنه . دەگێڕێتەوە ; پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

( أَسْـعَدُ النَّـاسِ بِشَـفَاعَتِي مَـنْ قَـالَ : لَا إِلَــهَ إِلّا اللــهُ خَالِصـاً مِـنْ قَلبِـهِ - أو: نَـفسِهِ)
واته: بەختەوەرتــرین کەس کە بەر شــەفاعەتی مــن دەکەوێــت کەســێکە بڵێـت لا إلــه إلَّا الله بە دڵسۆزی و نیاز پاکی بە دڵیەوە، یاخود لە دەروونیەوە.
وە لە صحيح دا هاتووە ، لەعُتبان ی
کوڕی مالیک . رضي اللهُ عَنهُ . لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی:
( إنَّ اللـهَ حَـرَّمَ عَلى النَّـارِ مَـنْ قـال :ـ لا إلـه الّا اللّـه ، يَبْتَغي بِـذٰلِكَ وَجْـهَ اللهِ عـَزَّ وَجَـلَّ)
واتە:- خــوای گەورە حەرامــی کــردووە لەســەر ئــاگر کەســێک کە بڵێـت لا إلــه إلَّا اللــه ، وە مەبەستی لەوەدا تەنها خوای گەورە بێت بە نیاز پاکییەوە.

وە کتێبــی ( اليــوم والليلــة ) ی نَسـائي /لە فەرمــوودەی دوو پیــاو لە هــاوەڵان دەگێــڕنەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ :-
( مَـنْ قـال:ـ لا إلـه إلّا اللهُ وُحـدَهُ لا شَـريكَ لَـهُ لَـهُ المُلْـكُ وَ لَـهُ الحَمـدُ وَهـوَ عَلـى كُلِّ شَـيئٍ قَـديرٌ، مُخلِصـاً بِهـا قَلبُـهُ ، يَصْـدِقُ بِهـا لِسـانُهُ، إلّا فَتَـقَ اللـهُ لَـهُ السَّـماءَ فَتْقـاً، حَتَّـى يَنظُـرَ إلــى قائِلِهـا مِـنْ أَهْـلِ الأَرْضِ ، وَ حَـقَّ لِعَبْـدٍ نَظَـرَ اللــهُ إلَيــهِ أنْ يُعْطِيَـهُ سُـؤلَهُ) واته:-
هەرکەسێک وتی ( لا إلـه إلّا اللهُ وُحـدّهُ لا شَـريكَ لَـهُ لَـهُ المُلْـكُ وَ لَـهُ الحَمـد وّهُـوَ عَـى كُلِّ شَــيئٍ قَــدير) بە نیــاز پــاکییەوە بڵێــت لە دڵــیەوە دەری ببڕێــت ، زمانیشــی بەڕاســتی دابنێــت، ئــیلا خــوای پەروەردگــار ئاســمان لەت دەکــا بــۆ ئەو کەســە، هەتــاوەکو ســەیری بێــژەرەکەی دەکــات لە ســەر زەوی وە مــافی بەندەیەکیشــە کە خــوای پەروەردگــار سەیری بکات کەوا هەر داوایەکی هەبێت پێی ببەخشێت.

**بەڵگەی ڕاستگۆیی:** الله تعالی فەرمویەتی:-
﴿ أَحَسِـبَ النَّـاسُ أَن يُتـرَكُوا أَن يَقُولُـوا آمَنَّـا وَهُـمْ لَا يُفْتَنُـونَ (2) وَلَقَـدْ فَتَنَّـا الَّـذِينَ مِـن قَـبْلِهِمْ فَلَـيَعْلَمَنَّ اللَّــهُ الَّــذِينَ صَــدَقُوا وَلَــيَعْلَمَنَّ الْكَـاذِبِينَ﴾[٦] واته: ئایـا خــەڵکی وایــانزانیوە، وازیــان لێــدەهێنرێت و پشــتگوێ دەخــرێن کــە بڵــێن ئیمــان و باوەڕمــان هێنــاوە، لەکاتێکــدا ئــەوان تــاقی نەکرێنــەوە و تووشــی ســزا و ئــازار نــەکرێن؟ـ ســوێند بــەخوا بێگومــان ئێمــە ئەوانــەی پــێش ئــەمانمان تاقیکردۆتــەوە بــە جۆرەهــا شــێوە، تــا خــوای گــەورە (لــە جیهــانی واقیعــدا) ئەوانــەی ڕاســتیان کــردووە بیانناســێت و دەرکــەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.
وە الله تعالی فەرموویەتی:
( وَمِـنَ النَّـاسِ مَـنْ يَقُـولُ آمَنَّـا بِاللَّـهِ وَبِـالْيَوْمِ الْآخِـرِ وَمـا هُـمْ بِمُـؤْمِنِينَ (٨) يُخَـادِعُونَ اللَّـهَ وَالَّـذِينَ آمَنُـوا وَمَـا يَخْـدَعُونَ إِلَّا أَنفُسَـهُمْ وَمَـا يَشْـعُرُونَ (٩) فِـي قُلُـوبِهِم مَّـرَضٌ فَـزَادَهُمُ اللَّـهُ مَرَضًـا وَلَهُـمْ عَـذَابٌ أَلِـيمٌ بِمَـا كَـانُوا يَكْـذِبُونَ )[٧] واته: لەنـاو خەڵکیـدا کەسـانێک هەن دەڵــێن: ئیمــان و باوەڕمــان بە خــواو بە ڕۆژی دوایــی هێنــاوە( لەڕاســتیدا ئەوان درۆ دەکەن) ئەوانە هەمیشــە بــاوەڕدار نــین. ئەوانە(بە خەیــاڵی خۆیــان وا دەزانــن ) خــودا و ئەو کەســانە دەخەڵەتێنــنکە بــاوەڕداری ڕاســتەقینەن! کەچــی جــگە لە خۆیــان کەســی تریــان پــێ ناخەڵەتێنرێــت، بەڵام هەســت نــاکەن و فــام نــاکەنەوە و بیرنــاکەنەوە. ئەوانە

له دڵ و دەروونیانــدا نەخۆشــی بــێ بــاوەڕی و حەســودی و کینــد هەیە، خــوایش (بە سەرخســتنی حەق و ئیمانــداران ) ئەوەنــدەی تــر دەردیــان گرانتــر و کــاریگەر دەکــات و ســزایەکی ســەختیش . لە دنیــاو قیامەتــدا . چاوەڕێیــانە بە هــۆی درۆ کــردن و . دژایەتیــان بۆ ئیسلام.

وە لە سوننــەتیشدا ئەوەی کە لە صــحیحین جێگیــر بــووە، لە مُعــاذی کــوڕی جبــل . رضي الله عنهُ . لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت:

( ما مِنْ أحَدٍ يَشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلَّا اللهُ وَ أنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ وَ رَسولُهُ، صادِقاً مِنْ قَلبِهِ، إلَّا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ ) واتە: هــیچ بەنــدەیەک نییــە کەوا شــاهیدی بــدا و دان پێــدا بنێــت کەوا هــیچ خــودایەک نییــە کە بە حەق شایســتەی پەرســتن بێــت جــگە لە الــله، وە مــوحەممەدیش بەنــدە ونێردراویەتــی، بەراستگــۆیی لە دڵــیەوە بێــتە دەرەوە، ئــیلا خوای پەروەردگار لەسەری حەرام دەکات کە بچێتە ئاگرەوە.

**بەڵگەی خۆشەویستی:** الله تعالی دەفەرمویَ:

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴾[8]

واتە: (لەگــەڵ ئــەو هــەموو بەڵگــە ئاشــکرایانەدا) هەنــدێك کــەس هەیــە لــەجیاتی ئــەوەی خواپەرســت بێــت، شــتانی تــر دادەتاشــێت بــۆ خــۆی و (شــوێن ڕێنموویيــەکانی خــوا ناکــەوێت و) خۆشەویســتی و ســۆزی دەدات بــەو بــت و بەرنامۆلکــەو توولــە ڕێگەیانــە و خۆشــی دەوێــن، وەك چــۆن ئیمانــداران خوایــان خــۆش دەوێــت، بــەڵام ئەوانــەی ئیمــان و باوەڕیان هێناوە زۆر زیاتر خوایان خۆش دەوێت (هەر بەراورد ناکرێت).

وە دەفەرموێت:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ﴾[9]

واتە : ئەی ئەوانــەی باوەڕتــان هێنــاوە، هــەر کــەس لــە ئێــوە لــە ئــاین و بەرنامەکــەی وەرگــەڕێت و پاشــگەز ببێتــەوە، ئــەوە (هــەر خــۆی زەرەر دەکــات) ئــەوە لــە ئاینــدەدا خــوا کەســانێک دەهێنێتــە کایــەوە (ئەوەنــدە ڕێــک و پێــک و بــاوەڕ دامــەزراون) پــەروەردگاری مــەزن خۆشــی دەوێــن، ئــەوانیش ئــەویان خــۆش دەوێــت، هــەروەها ملکــەچ و فەرمانبــەردارو بەســۆزن بــۆ ئیمانــداران و ســەربڵندو نــەخۆرو دەروون بــەرزن بەســەر بــێ باوەڕانــدا، لــە پێنــاو ڕێبــازی خــواداو بــۆ بەدەســتهێنانی ڕەزامەنــدی ئــەو هــەوڵ دەدەن و خەبات دەکەن و تێدەکۆشن، لە لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن.

وە لە ســوننەتدا ئەوەی جێگیــرە لە صــحیح دا هــاتووە ، لە أنَــس رضــي اللــه عنــه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

( ثَلاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوَةَ الإيمانِ أنْ يَكُونَ اللهُ وَ رَسولُهُ أحَبُّ إلَيهِ مِمَّا سِواهُما، وَأنْ يُحِبَّ المَرءُ لا يُحِبُّهُ إلَّا لِله، وَ أنْ يَكرَهَ أنْ يَعُودَ في الكُفرِ بَعْدَ إذ أنقَذَهُ

(اللــهُ مِنــهُ كَمَــا يكــرَهُ أنْ يُقــذَفَ فِــي النَّــارِ) واتە : ســێ شــت لە هەرکەســێکدا هەبێـت ئەوا تـامی شـیرینی ئیمـان دەدۆزێـتەوە; خـودا و پێغەمـبەرەکەی خۆشـبوێت لە هەمـوو شـتێک زیـاتر، وە هەرکەسـێکی خۆشویسـت تەنهـا لەبەر اللـه بێـت، پێشـی ناخۆشـبێت بگەڕێـتەوە نـاو کـوفر, دوای ئەوەی کە خـوای پەروەردگـار ڕزگـاری کـرد لێـی, هەروەک چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتەوە ناو ئاگرەوە.

**بەڵگەی ملکەچ بوون:** الله تعالی دەفەرموێت:

﴿ وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾[10]

واتە: هــەوڵ بــدەن هەمیشــە و بــەردەوام دڵتــان لای خوابێــت و بگەڕێنــەوە بــۆ لای پــەروەردگارتان و تەســلیمی ئــەوبن، پــێش ئــەوەی کــە ســزای خــوا یەخــەتان بگرێــت لەوەودواش سەرکەتوو نابن کەس نابێت بەرگریتان لێ بکات.

وە دەفەرموێت:

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴾[11] واتە: کـێ هەیـە ئـاینی چـاکترە پەسـەندترو جـوانتر بێـت لـەو کەسـەی ڕووی کردۆتـە خـوا و خـۆی تەسـلیمی ئەوزاتـە کـردووەو لەکاتێکـدا کـارجوان و کـار پەسـەندەو شـوێنی ئـاینی ئیبراهیمـی ملکـەچ و فەرمانبـەردار کـەوتبێت، کە خوا ئیبراهیمی کردۆتە خۆشەویستی خۆی ڕێزداری کردووە.

وە دەفەرموێت:

﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ ﴾[12]

واتە: ئـەو کەسـەی ڕوو بکاتـە پـەروەردگاری و کارەکـانی هـەمووی بگێڕێتـەوە بـۆ لای ئـەو، لـە کاتێکـدا ئـادەمیزادێکی چاکـەخوازە، ئـەوە بەڕاسـتی مانـای وایـە کـە دەسـتی گرتـووە بـە بە هێزترین هۆکاری ڕزگاربوونیەوە.

لا اله الا الله

وە دەفەرموێـت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾[13] واتە: نـەخێر، سـوێند بـە پـەروەردگارت ئەوانـەی (لافـی بـڕوا لێـدەدەن) بـڕوا نـاهێنن هـەتا لـە هـەموو کێشـەیەکدا کـە ڕوودەدا لـە نێوانیانـدا تـۆ نەکـەن بـە دادوەرو گوێڕایـەڵی تـۆ نەکـەن، دوای ئـەوەش نابێـت لـە دڵ و دەروونیانـدا هـیچ نارەزاییـەک دروسـت ببێـت بەرامبـەر ئـەوەی کـە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

وە لە سوننەتدا پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:

( لا يُـؤمِنُ أحَـدُكُمْ حَتَّـى يَكُـونَ هَـواهُ تَبَعـاً لِمـا جِئْـتُ بِـه) واتە: هـیچ یەکێـک لە ئێـوە بـــاوەڕی تەواو نابێــت تـــاوەکو هەواو ئـــارەزوو پێخۆشـــبوونی خـــۆی نەکـــات بە

شـــوێنكەوتنی ئەو بەرنــامەی كە مــن هێنــاومە. ئەوەشــ تەواویەتــی و ئەوپەڕی ملــكەچ بوونە.

**بەڵـگەی قبوڵكـردن:** اللـه تعـالی دەفەرموێـت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ (٢٣) ۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ (٢٤) فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴾[١٤]

واتە: هــەر بــەو شــێوەیە هــیچ پێغەمبــەرێكمان نــەناردووە بــۆ هــیچ شــارێك، كــە خۆشــگوزەرانەكان نــەیانوتبێت: ئێمــە بــاوو بــاپیرانی خۆمــان بینیــووە پابەنــدی بیروباوەڕێـك بـوون، بێگومـان ئێمـەش چـاو لـەوان دەكـەین و پـەیڕەوی ئـەوان دەكـەین. پێغەمبەرەكـەش وتوویـەتی: باشـە... ئەگـەر لـە ڕێگـە و ڕێبـازو بەرنامـەی بـاو و باپیرانتـان چاكتریشـم بـۆ هێنـان هـەر شـوێنیان دەكـەون؟! لـە وەڵامـدا وتیـان: بەڕاسـتی ئێمـە بـەو بەرنامـە و پەیامـەی كـە بـە ئێـوەدا ڕەوانـە كـراوە بـڕوا ناكـەین. جـا ئێمـەش تۆڵـەمان لێسـەندن، سـەرنج بـدە و ببینـە سـەرئەنجامی ئەوانـەی بڕوایـان بـە پـەیامی پێغەمبـەران نەكرد چۆن بوو.

وە دەفەرموێـت: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ(٣٥) وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴾[١٥]

واتە: ئەوانـە كـاتی خـۆی كـە پێیـان دەوتـرا: هـیچ خوایـەک نیـە جگـە لـە (اللـە) سـەریان بـادەدا و فوویـان دەكـردە خۆیـان و فیزیـان دەكـرد... دەیـانوت: ئێمـە چـۆن واز لـە خواكانمان دەهێنین بۆ شاعیرێكی شێت؟!

وە لە سوننـەتدا ئەوەی كە لە صـحیحدا جێگیـر بـووە , لە أبي موسـى .رضي اللـه عنـه . لە پێغەمـبەر .ﷺ ـ فەرمـویەتی: ( مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى والْعِلْمِ كَمَثَلَ غَيْثٍ أَصَابَ أَرْضاً فكَانَ مِنها نِقِيَّةٌ قبِلَتِ الْمَاءَ فأَنْبَتتِ الْكلأَ والْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمسكَتِ الماءَ، فَنَفَعَ اللَّه بِهَا النَّاس...فَنَفَعَ اللَّه بِهَا النَّاس فَشَرِبُوا مِنْهَا وسَقَوْا وَزَرَعَوا. وأَصَابَ طَائِفَةٌ مِنْهَا أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعانٌ لا تُمْسِكُ مَاءً وَلا تُنْبِتُ كَلأً فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينَ اللَّه، وَنَفَعَه بمَا بعَثَنِي اللَّه بِهِ، فَعَلِمَ وعَلَّمَ، وَمثلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذلِكَ رَأْساً وِلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ) واتــە: نمــوونەی ئەو ڕێنمــایی و زانســت و دیــنەی كە خــوای پەروەردگــار منــی پــێ ڕەوانە كــردووە، نمــونەی وەكــو بــارانێكی زۆر وایە،دادەبــارێتە ســەر زەویەک: بەشــێك لەو زەویــیە زەوییەكــی چــاكە و بە پیــتە ئــاوەكە وەردەگرێــت و گــژو گیــایەكی زۆر دەڕوێــت لەســەر ئەو زەویــیە، وە بەشــێك لەو زەویــیە زەوییەكــی بــێ پیتــە,ئــاوەكە دەگــرێتە خــۆی , و بە هــۆیەوە ســود بە خەڵكێــک دەگەیەنێــت و لەو ئــاوە دەخــۆنەوە و مەڕومــاڵاتی پــێ ئــاو دەدەن، كشــتوكاڵی پــێ دەكەن. وە بەشــێكی تــر لەو زەویــیە كە زەویەكــی لــوس و بــێ پیــت و بــێ بەرەكەتە، نە ئــاو دەگــرێتە خــۆی و نە گژوگیاشــی لــێ دەڕوێــت ئەمەش نمــونەیە لەســەر ئەوەی ( یەكەم) وەک كەســێک وایە لە دینــی خــوا تێبگــات و شــارەزا بێــت و ســودی لێبیبنێــت لەو ڕێنمایەی كە منی پێ ناردووە، و خۆی شارەزا دەبێت و خەڵكیش فێر دەكات.

(نمــــونەی دووەمــــیش) وە ئەوکەســــە وایە کە هەر ســــەری خــــۆی بەو دیـــنە بەرز نەکردبێتەوە، و (سێیەمیش) ئەو ڕێنوێنیەی کە خودا پێی ناردووم قبوڵی نەکردووە.

## هەڵوەشێنەرەوەکانی إسلام

باش بزانە کە لە گەورەترینی هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دە خاڵن

یەکەم: هاوبەش بڕیاردان بۆ الله لە پەرستنیدا، الله تعالی دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ [١٦] واتە: بەڕاستی خـوا خـۆش نابێت لـەوە هـاوەڵ و شـەریکی بـۆ بڕیـار بـدرێت و جگـە لـەو (هاوبـەش دانانـە) لـە گوناهـانی تـر بـۆ هـەر کـەس بیـەوێت و شایسـتە بێـت و (پەشـیمان بێـت) خـۆش دەبێـت، جـا ئـەوەی شـەریک و هـاوەڵ بـۆ خـوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور.

وە فەرمـوویەتی: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾ [١٧] واتە: سـوێند بـەخوا بەڕاسـتی، ئەوانـە بـێ بـاوەڕ بـوون کـە وتیـان: خـوا هـەر مەسـیحی کـوڕی مەریەمـە (بەمـەرجێک) مەسـیح وتوویـەتی: ئـەی نـەوەی ئیسـرائیل، ئـەو خوایـە بپەرسـتن کـە پـەروەردگاری مـن و پـەروەردگاری ئێوەشـە و دڵنیابن ئـەوەی شـەریک و هاوبـەش بـۆ خـوا بڕیـار بـدات، ئـەوە بێگومـان خـوا بەهەشـتی لەسـەر حـەرامکردووە و شـوێن و جێگـاو سـەرەنجامی ئـاگرە، ئەوسـا ئەوسـتەمکارانە هـیچ جـۆرە پشـتیوانێکیان نـی یـە (کـەس ناتوانێـت فریایـان بکەوێت).

وە بەشـێک لە هـاوبەش دانـان قوربـانی کـردنە بـۆ جـگە لە الـله, وەکـو کەسـێک قوربـانی بکات بۆ جن یان بۆ گۆڕێک.

دووەمــ: هەرکەســێک لە نێـوان خــۆی و خــوای پەروەردگـار واســتە دابنێـت, و لێیـان بپـاڕێتەوە و داوای شــەفاعەتیان لـێ بکـات، پشــتیان پــێ ببەســتێت، بەیەک دەنگــی زانایان کافرە (پێی لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە)

سێیەمــ: هەرکەســێک موشــریکەکان بە کــافر نەزانێــت یــان گومــانی لە کــافر بوونیـان هەبێت یان ڕێبازەکەیان بە ڕاست بزانێت، ئەوا پێی لە دین ئەچێتە دەرەوە.

چوارەمــ: هەرکەسـێک بـاوەڕی وابێـت کەوا ڕێبـازی جـگە لە پێغەمـبەر ﷺ ـ باشـترە لە ڕێبــازی ئەو, یــان پێــی وابێــت حــوکمی جــگە لەو باشــترە لە حــوکمی ئەو، وەکــو ئەوکەسـەی حـوکمی طاغوتەکـان بە باشـتر دەزانـێ بەسـەر حـوکمی پێغەمـبەر ﷺ ـ ئەوا کافرە.

پێنجەمــ: هەرکەسـێک ڕقـی لە شـتێک بێــتەوە کە لە پێغەمــبەرەوە ﷺ ـ هاتـووە، هەرچەندە خۆیشی کاری پێبکات, هەر کافر دەبێت.

شەشەم: هەرکەسێک سوکایەتی و گاڵتە بە شتێک بکات لە دینی پێغەمبەر ﷺ ـ یان گاڵتە بە پاداشتێکی بکات یان بە سزایەکی، ئەوە پێی کافر دەبێت ، وە بەڵگەش وتەی الله تعالی دەفەرموێ:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ (٦٥) لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾[١٨] واتە: (کاتێک تۆ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت) و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟! (ئیتر بێ سوودە) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو.

حەوتەم: سیحر "جادوو" ، بەشێک لە سیحر لێکترکردن و خۆشەویستی دروستکردنە، هەرکەسێک کردی یان پێی ڕازی بێت ئەوا کافرە. بەڵگەش فەرموودەی الله تعالى

﴿ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ﴾[١٩] واتە: ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێك نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقی کردنەوەیەو خۆت کافر مەکە.

هەشتەم: سەرخستن و یارمەتیدانی موشریکەکان بەسەر مسوڵماناندا، بەڵگەش ووتەی الله تعالی: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾[٢٠] واتە: ئەوکەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات...

نۆیەم: هەرکەسێک بڕوای وابێت کەوا هەندێک لە خەڵک بۆیان هەیە دەربچن لە شەریعەت و ڕێبازی محمَّد ﷺ ـ هەر وەک چۆن . خضر . عليه السلام بۆی هەبوو دەرچێت لەشەریعەتی موسا عليه السلام، ئەوا کافرە.

دەیەم: پشتکردن لە دینی خوای پەروەردگار ، کە نەشارەزای بێت و نەفێری بێت و نەکاریشی پێبکات، وە بەڵگەش وتەی الله تعالی:

﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِآيَاتِ رَبِّهِ ثُمَّ أَعْرَضَ عَنْهَا إِنَّا مِنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ ﴾[٢١]
واتە: جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە بە فەرموودەکانی خوا یاداوەری و ئامۆژگاری کرابێت، پاشان پشتی لێ هەڵکربێت و گوێی پێنەدات، بەڕاستی ئێمە تۆڵە لە تاوانبارو تاوانکاران دەستێنین.

*وە هیچ جیاوازییەک نییە لە ئەنجامدانی ئەو هەڵوەشێنەرەوانەدا، لە نێوان گاڵتەکردن بێت یان بە ئەنقەست بێت یان بە ترسەوە بێت; ئیلا کەسێک کە زۆری لێکرابێ وە هەموویان لە ترسناکترینەکانن وە لە هەموشیان زیاتر ڕوودەدەن.

## جۆرەکانی یەکخواپەرستی " التوحید"

یەکخواپورستی سێ جۆرە:-

**یەکەم:** یەکخواپەرستی پەروەردگاریەتی:-

ئەو جـــۆرەیە کەوا بـــێ باوەڕەکـــانی ســـەردەمی پێغەمـــبەر ﷺ ــ دانیـــان پێدانـــاوە، وە پێغەمـبەر ﷺ ــ شـەڕی لەگەڵ کـردوون , وە نەیشـی خسـتنە نـاو ئیسـلامەوە،وە خـوێن و ماڵیشیانی حەڵاڵ کرد،

ئەوەش بە تاک دانانی الله لە کردەوەکانی خۆیدا.

بەڵگەش فەرموودەی الله تعالی:

﴿ قُـلۡ مَـن يَـرۡزُقُكُم مِّـنَ ٱلسَّـمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أَمَّـن يَمۡلِـكُ ٱلسَّـمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَـٰـرَ وَمَـن يُخۡـرِجُ ٱلۡحَـيَّ مِـنَ ٱلۡمَيِّـتِ وَيُخۡـرِجُ ٱلۡمَيِّـتَ مِـنَ ٱلۡحَـيِّ وَمَـن يُـدَبِّرُ ٱلۡأَمۡـرَۚ فَسَـيَقُولُونَ ٱللَّـهُۚ فَقُـلۡ أَفَـلَا تَتَّقُـونَ﴾[٢٢] واتـــە: (ئـــەی پێعەمبـــەر صـــلی اللـــە علیـــە وســـلم پێیـــان بڵـــێ): کـــێ هەیـــە لەئاســـمانەوە (بـــەهۆی تیشـــکی خـــۆرو بارانـــەوە) و لەزەویـــەوە (بـــەهۆی خـــاک و ئـــاوو هـــەواوە) ڕزق و ڕۆزیتـــان بـــۆ فەراهـــەم بهێنێـــت و پێتـــان ببەخشـــێت، ئـــەی کـــێ هەیـــەخاوەنی دەزگاکـــانی بیســـتن و بینـــین بێـــت (توانـــای بیســـتن و بینینیـــان پـــێ ببەخشـــێت) ئـــەی کـــێ زینـــدوو لـــەمردوو دەردەهێنێـــت و مـــردوو لەزینـــدوو دەردەهێنێـــت، هـــەرواها کـێـــە کەهـــەموو کـــارو فرمانـــەکان جێبـــەجێ دەکـــات و گۆڕانکاریـــان بەســـەردا دەهێنێـت (لەبەرامبـەر هـەموو ئـەو پرسـیارانەوە) خـەڵکی دەڵـێن: اللـە، خـوا (هـەموو ئـەو کارانـەو زیـاتریش زۆر بەئاسـانی ئـەنجام دەدات لەڕێگـەی یاسـاو بەرنامەیەکەوەکەهـەر خـۆی دایڕشـتووە)، کەواتـەپێیان بڵـێ: ئایـا ناترسـن لەسـەرەنجامی یـاخی بوونتـان، ئایـا ناترسن لەخەشم و قینی خوا؟ !

بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆر زۆرە.

**دووەم:** یەکخواپەرستی لە پەرستندا:-

ئەو جـــۆرە یەکتاپەرســـتیەیە کە کێشـــەی تێـــدا کەوتـــووە لە کـــۆن و ئێستاشـــدا، بە تـــاک دانـانی خـــوای پەروەردگـــار لە کـــردەوەی بەنـــدەکان" وەکـــو پـــاڕانەوە, شـــت لەســـەر خـــۆ پێویسـت کـردن . نـذر . قوربـانی, هیـوا و ئومێد پێبـوون, تـرس, پشـت پـێ بەسـتن, ئومێد بە وەرگرتنـی پاداشـتی خـــودا, تـــرس لە وەرگرتنـــی ســـزای خـــودا, گەڕانەوە" و هەرجۆرێـــک لەو جۆرانەش بەڵگەیان لەسەرە لە قورئاندا.

**سـێیەم:** بەتـاک دانـانی اللـە کە بەهـیچ زاتێکـی تـر ناچێـت و نـاو و سیفاتەکانیشـی :-

الله تعالی فەرموویەتی:

﴿ قُـلۡ هُـوَ ٱللَّـهُ أَحَـدٌ(١) ٱللَّـهُ ٱلصَّـمَدُ(٢) لَـمۡ يَلِـدۡ وَلَـمۡ يُولَـدۡ (٣) وَلَـمۡ يَكُـن لَّـهُۥ كُفُـوًا أَحَـدُۢ ﴾[٢٣] واتـە: (ئـەی محمـد (صـلی اللـە علیـە وسـلم) ئـەی ئیمانـدار) بڵـێ: ئـەو خـوای کـە نـاوی _ اللـە_ خوایـەکی تـاک و تەنهایـە (بـێ هـاوەڵ و هاوتایـە)، خـوا زاتێکـی پایـەدار و

دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییەو هەموویان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵاو و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێ بە جێ بکات، هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆشی لە کەس نەبووە هەرگیز هاوتاو هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە کە لەبەرامبەریەوە بەوەستێت و هاوشانی بێت.

وە فەرمویەتی: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾[٢٤] واتە: ـ هەر بۆ خوایە هەموو ناوە جوان و پیرۆزەکان، جا (ئەی ئیمانداران) بەو ناوانە دوعا و نزا بکەن و هاناو هاوار بۆ ئەو زاتە بەرن، واز بهێنن لەوانەی کە لە ناوە پیرۆزەکانی خوادا لادان دەکەن و (سیفەت و ناوەکانی خوا بەکاردەهێنن بۆ غەیری خوا)، لە ئایندەدا پاداشتی ئەوکارو کردەوانەیان وەردەگرن کە ئەنجامیان دەدا.

وە فەرموویەتی:

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴾[٢٥] واتە: هیچ شتێك نیە لە وێنەی ئەوزاتە، هیچ شتێك لەو ناچێت (چونکە خوایە و بەدیهێنەرە، چۆن لە بەدیهێنراوەکانی دەچێت) هەر ئەویش بیسەرو بینایە.

## جۆرەکانی هاوبەش بڕیار دان

دژی یەکخواپەرستی هاوبەشدانانە بۆ خوا (الشرك ).

ئەوەش سێ جۆرە;

**هاوبەش بڕیاردانی گەورە..**

**هاوبەش بڕیاردانی بچووك..**

**هاوبەش بڕیاردانی شاراوە..**

جۆری یەکەم لە جۆرەکانی شیرك :- هاوبەش بڕیاردانی گەورە:

ئەو جۆرە خوای پەروەردگار لێی خۆش نابێت' وە هیچ کردەوەیەکی چاکیشی لێوەرناگرێت.

الله عز وجل فەرمووی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾[٢٦] واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر کەس بیەوێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریک و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومرا بووە بەگومڕاییەکی زۆر دوور.

وە فەرمویوتی سبحانە:

﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾[٢٧] واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی، ئەوانە بێ باوەڕ بوون

کە وتیان: خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە (بەمەرجێک) مەسیح وتوویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و دڵنیابن ئەوەی شەریک و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەوستەمکارانە هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نی یە (کەس ناتوانێت فریایان بکەوێت).

وە فەرمویەتی سبحانە:

﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾[٢٨] واتە: کاتێک هاتین و تەماشای ئەوەمان کرد کە کردوویانە (هەمووی تاوان بوو) بەربامانداو کردمانە تەپوتۆزێکی پەرش و بڵاو.

وە فەرمویەتی سبحانە:

﴿ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[٢٩] واتە: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ریزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

وە فەرمویەتی سبحانە:

﴿ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾[٣٠] واتە: خۆ ئەگەر شەریک و هاوبەش بڕیار بدەن، ئەوە هەرچی کارو کردەوەیەکی (چاکیشیان) هەیە هەمووی پووچ و بێ نرخ دەبێت.

## هاوبەش بڕیاردانی گەورە چوار جۆری هەیە:

یەکەم: هاوبەش بڕیاردان لە پاڕانەوەدا، بەڵگەش فەرمودەی الله تعالى:

﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾[٣١] واتە : هەر کاتێک خەڵکی (باوەڕ لاواز) سواری کەشتی دەبن، مەترسی نوقم بوون و تیاچوون ڕوویان تێدەکات، زۆر بەکوڵ، هاناو هاوار بۆ خوا دەبەن و بە دڵسۆزی و ملکەچیەوە باوەڕ دەهێنن، بەڵام کاتێک خوا ڕزگاریان دەکات و دەگەنەوە وشکانی دەستبەجێ لە ڕێبازی یەکتاپەرستی دەترازێن و هاوەڵ و هاوبەش بۆ خوا بڕیار دەدەن.

دووەم: هاوبەش بڕیاردان لە نیيەت و مەبەستدا: بەڵگەش فەرمودەی الله تعالى:

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴾[٣٢] واتە: هەر کەسێك تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەیی و (خۆشگوزەرانی) یەکەی بوێت. ئەوە پاداشتی هەوڵ و کۆششی ئەو جۆرە کەسانە دەدەینەوە لە دنیادا، ئەوانیش تێیدا هیچیان لێکەم ناکرێتەوە.

سێیەم : هاوبەش بڕیاردان لە گوێڕایەڵیدا: بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:
﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾[٣٣] واتە: ـ (گاورو جوو) حاخام و قەشەکانی خۆیان کردۆتە پەروەردگاری خۆیان لە جیاتی خوا (ملکەچ و فەرمانبەرداریانن، ئەوانیش بەئارەزووی خۆیان شتیان بۆ حەڵاڵ یان حەرام دەکەن) هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیش (بەکوڕی خوا دەزانن) لەکاتێکدا کە فەرمانیان پێنەدراوە جگە لە پەرستنی تاکە خوایەک، بێگومان جگە لەوزاتە خوایەکی تر نیە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەیە، کە (ئەو نەفامانە) هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن.
وە تەفسیری ئایەتەکە کە هیچ ئیشکالێکی تێدا نییە، گوێڕایەڵیکردنی زانایان و خواپەرستان لە شتیکدا کە تاوانە و بێ فەرمانییە، نەک داوایان لێ بکرێت، هەر وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ ـ ئەو ئایەتەی وا شیکردوەتەوە بۆ عەدي کوڕی حاتَم رضي الله عنه ، کاتێک پرسیاری لێکرد وتی" ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست"
ئەویش ﷺ . بۆی باس کرد : کە پەرستنیان لە گوێڕایەڵی کردنیانە بۆ سەرپێچییەکان.

چوارەم: هاوبەش بڕیاردان لە خۆشەویستیدا: بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:
﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾[٣٤] واتە: (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێك کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی خواپەرست بێت، شتانی تر دادەتاشێت بۆ خۆی و (شوێن ڕێنموییەکانی خوا ناکەوێت و) خۆشەویستی و سۆزی دەدات بەو بت و بەرنامۆلکەو توولە ڕێگەیانە و خۆشی دەوێن، وەك چۆن ئیمانداران خوایان خۆش دەوێت،

جۆری دووەم لە جۆرەکانی شیرک: هاوبەش بڕیاردانی بچووك :-
ئەوەش ڕووپامایی (ڕیا) یە، بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:
﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾[٣٥]
واتە:جا ئەوەی دەیەوێت بەدیداری پەروەردگاری شادببێت، بەخۆشنودیەوە باکارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەک لە پەرستندا هیچ کەسێک نەکاتە هاوەڵ و شەریک بۆی.

جۆری سێیەم لە جۆرەکانی شیرك: هاوبەش بڕیاردانی شاراوە، بەڵگەش فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ .
( الشِّرْكُ في هَذِهِ الأُمَّةِ أخْفى مِنْ دَبيبِ النَّمْلَةِ السَّوداءِ عَلى صَفاةٍ سَوْداءَ في ظُلْمَةِ اللَّيلِ) واتە: شیرک لە ناو ئەم ئەممەتەدا شاراوەترە لە شوێن پێی مێرولەیەکی ڕەش, لەسەر بەردێکی لووسی ڕەش, لە شەوێکی تاریکدا.

وه . ﷺ . فەرمووى ، كەفارەتەكەيشى:
( اللَّهُمَّ إِنِّي أَعوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ شَيئاً وَ أَنَا أَعْلَمُ، وَ أَسْتَغْفِرُكَ مِنَ الذَّنْبِ الَّذي لَا أَعْلَمُ) واتە: ئەی پەروەردگارا من پەنات پێ دەگرم لەوەی هاوبەش بۆ تۆ بڕیار بدەم لە کاتێکدا کە دەزانم، وە داوای لێخۆشبوونیشت لێدەکەم لە تاوانێك کە نایزانم.

## جۆرەکانی کوفر

کوفر دوو دانەیە:

### جۆری یەکەم: کوفرێک لە ئیسلام پێی دەردەچێت.

*ئەوەش پێنج جۆرە:-

یەکەم جۆر: کوفری بە درۆزانین: بەڵگەش فەرموودەی الله تعالى:
﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾ [٣٦] واتە: جا ئیتر کێ لەوە ستەمکارترە کە درۆ هەڵدەبەستێت و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدات، یان ئەو حەق و ڕاستیەی کە بۆی هاتووە بە درۆی دەزانێت، مەگەر هەر دۆزەخ شایستە بێت، ئایا لە دۆزەخدا جێگە و ڕێگەیەکی هەمیشەیی بۆ بێ باوەڕان دابین نەکراوە؟ (بێگومان ئامادە کراوە).

دووەم جۆر: کوفری وەرنەگرتن و خۆ بەگەورە زانین ( لە ئاستی حەق) لەگەڵ ئەوەشدا بڕوایان پێیەتی و بەڕاستی دەزانن، بەڵگەش فەرمودەی الله تعالى:
﴿ وَ إِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾[٣٧] واتە: کاتێکیش بەفریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا، وەکو ڕووگەیەك) سوژدەیان برد، جگە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کردو خۆی بە گەورەزانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.

سێیەم جۆر: کوفری شك و گومان, بەڵگەش فەرموودەی الله تعالى:
﴿ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا (٣٥) وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا (٣٦) قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا(٣٧) لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴾ [٣٨] واتە: ڕۆژێك چوو بۆ سەردانی یەكێك لە باخەکانی (لەگەڵ هاوەڵەکەیدا) لەکاتێکدا کە ستەمکار بوو لە خۆی (بەهۆی لە خۆبایی بوونیەوە)، بۆیە لەبەرخۆیەوە وتی: گومان نابەم کە ئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت... واش گومان نابەم کە قیامەت بەرپا دەبێت، سوێند بە خوا ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم، ئەوە دڵنیام کەلای ئەویش جێگەو ڕێگەو چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادە کراوە.
هاوەڵە ئیماندارەکەی لەکاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت: ئایا باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروست کردووە؟! لەوەودوا نوفتەیەك بوویت، پاشان کردیتی بە پیاو؟!! بەڵام من دەڵێم کە:_اللە_ (بەدیهێنەری هەموو

بوونــەوەر)، هــەر ئــەو پەروەردگارمــە، هــیچ جــۆرە هــاوەڵ و شــەریکێك بــۆ ئــەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم.

چوارەم جۆر: کوفری پشتهەڵکردن لە دین ، بەڵگەش فەرموودەی الله تعالی:

﴿ وَٱلَّـذِينَ كَفَـرُواْ عَمَّآ أُنـذِرُواْ مُعْرِضُـونَ ﴾[39] واتە: کەچـی بـێ بـاوەڕان پشـت هەڵدەکـەن لەو ئاگاداری و بێدارکردنەوەیە.

پێنجەم جۆر: کوفری دوڕوویی: بەڵگەش فەرموودەی الله تعالی:

﴿ ذَٰلِـكَ بِـأَنَّهُمْ ءَامَنُـواْ ثُـمَّ كَفَـرُواْ فَطُبِـعَ عَلَـىٰ قُلُـوبِهِمْ فَهُـمْ لَا يَفْقَهُـونَ ﴾[40] واتە: ئەو حاڵەتەشـیان بۆیـە تێـدا دروسـت بـووە چونکـە سـەرەتا باوەڕیـان هێنـا؛ لـەوەودوا حـەقیان پۆشــی و کــافر بوونــەوە، بــەهۆی ئــەوەوە مــۆر نــرا بەســەر دڵیانــدا (بۆیــە تێگەیشــتن و بیروبۆچوونیان شێواوە و) لە ڕاستیەکان تێ ناگەن.

## جۆری دووەم لە جۆرەکانی کوفر:

بریتــییە لە کــوفری بچــووك، کە لە ئیســلام پێــی ناچێتــە دەرەوە، ئەوەش کــوفر کردنــە بە بەخششی نیعمەتەکان.

بەڵگەش فەرموودەی الله تعالی:

﴿ وَضَـرَبَ ٱللَّـهُ مَـثَلًا قَرْيَـةً كَانَـتْ ءَامِنَـةً مُّطْمَئِنَّـةً يَأْتِيهَـا رِزْقُهَـا رَغَـدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَـرَتْ بِـأَنْعُمِ ٱللَّـهِ فَأَذَٰقَهَـا ٱللَّـهُ لِبَـاسَ ٱلْجُـوعِ وَٱلْخَـوْفِ بِمَـا كَـانُواْ يَصْـنَعُونَ ﴾[41] واتە: خــوا نموونــەی هێناوەتــەوە (بــە دانیشــتوانی) شــارێك کــە ژیانیــان بــە هێمنــی و ئاســوودەیی دەبــردە ســەر، لــە هــەموو لایەکــەوە ڕزق و ڕۆزی جــۆراو جۆریــان بــۆ دەهــات (بــەڵام لــە جیــاتی سوپاســگوزاریی) ناشــوکرو قەدرنــەزانی نــازو نیعمەتــەکانی خــوا بــوون، ئینجــا خــوای گــەورە پۆشــاکی برســێتی و ترســی کــردە کــاڵای باڵایــان و تــاڵاوی نــەداریی و ترســی پــێ چەشــتن لــە ســەر ئــەنجامی ئــەو ئــیش و کــارە (ناپوخــت و ناڕێکانــەدا) کــە دەیــانکردە پیشەی خۆیان.

# جۆرەکانی دووڕوویی

(نفاق) دوڕوویی دوو جۆرە: بیروباوەڕی و کرداری

دوڕوویی بیروباوەڕی:

شەشـــ جـــۆرە، خـــاوەنەکەی لەوکەســـانەیە کە نیشـــتەجێی هەرەژێـــرەوەی ئـــاگری دۆزەخن.

یەکەم: بە درۆزانینی پێغەمبەر ﷺ .

دووەم: بە درۆزانینی هەندێک لەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی .

سێیەم: رق بوونەوە لە پێغەمبەر ﷺ .

چوارەم: رق بوونەوە لە هەندێک لەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی .

پێنجەم: دڵخۆش بوون بە کەمبوون و لاوازبوونی دینی پێغەمبەر ﷺ .

شەشەم: پێ ناخۆش بوون بە سەرکەوتنی دینی پێغەمبەر ﷺ .

دوڕوویی کردەوەیی:

دوڕوویی کرداری پێنج جۆری هەیە, بەڵگەش فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ :-

( آيَـةُ المُنـافِقِ ثَـلَاثٌ : إذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وَ إذَا وَعَـدَ أخْلَـفَ، وَ إذَا ائْـتُمِنَ خَـانَ ) و فـي رواية: ( وَ إذَا خاصَمَ فَجَرَ، وَإذَا عَاهَدَ غَدَرَ) {بخاری,مسلم}

واتە:- نیشانەی دوڕوو سێ دانەیە:

هەرجارێـــک قســـەی کـــرد درۆ دەکـــات، وە ئەگەر بەڵێنـــی دا دەیشـــکێنێت، وە ئەگەر شتێکی بە ئەمانەت لا دانرا خیانەتی لێدەکات.

وە لە گێڕانەوەیەکـــی تـــردا: و ئەگەر کێشـــەیەک هەبێـــت گەورەی دەکـــا وە ئەگەر بەڵێنیدا نایگەیەنێتە جێ. واتای طاغوت و سەرکردەی جۆرەکانیان

باشـ بـزانە ڕەحمەتـی خـوات لێبێـت ، یەکەم شـت کە اللـه فەرزی کـرد لەسـەر ئـادەم کـوفر کـردن بـوو بە تـاغووت و باوەڕهێنـان بـە اللـه، بەڵـگەش فەرمـوودەی اللـه تعالی:

﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴾[٤٢] واتە: سـوێند بـە خـوا بێگومـان ئێمـە لـەناو هـەر گـەل و نەتەوەیەکـدا پێغەمبـەرێکمان ڕەوانـەکردووەو پێمـان ڕاگەیانـدووە کـە پێیـان بڵێـت: تـەنها خـوا بپەرستن، خۆتـان دوورە پـەرێز بگـرن لـە هەموو پەرستراوێکی تر.

جـا سـیفەتی کـوفر کـردن بە طـاغوت ئەوەیە کە بـاوەڕت هەبێـت بە باتـڵ بـوونی هەمـوو پەرسـتنێک بـۆ جـگە لە اللـە، وە وازی لێبهێنیـت و ڕقـت لێـی بێـت و خاوەنەکەشـی کـافر بکەیت و لێی دووربکەویتەوە.

...وە باوەڕهێنـانیش بە اللـە ئەوەیە کە بـاوەڕت هەبێـت کە اللـە خـودای پەرسـتراوە و تـاک و تەنهـایە و بەبـێ هـیچ کەسـێکی تـر، وە هەمـوو جـۆرە پەرسـتنەکانت بە تەواوی بـۆ اللـە بێـت, وە نەفـی هەمـوو جـۆرە پەرسـتراوێکی تـر بکەیـت جـگە لەو، وە هەمـوو

نیاز پاک و دڵسۆزێکت خۆشبوێت و دۆستایەتیت بۆیان هەبێت، وە ڕقت لە هاوەڵپەیداکەران بێتەوە و دوژمنایەتیت هەبێت بۆیان.

ئەوەش میلەتی '' إبراهیم ''ە , کە هەرکەسێک دژی وەستایەوە تیاچوو.

وە ئەویش پێشەوا و نموونەیە کە اللە تعالی ڕایگەیاندووە دەفەرموێت:

﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ ﴾[٤٣] واتە: ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن.

**طاغوت :-** وشەیەکی گشتی یە هەمــوو ( پەرستراوێك ) دەگرێتەوە جگە لەخوا، پەرستراوەکە ڕازی بێت بە پەرستن و گوێ ڕایەڵی شوێن کەوتوانی, لەفەرمانەکانی { نەگونجاو } لەگەڵ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیدا صل اللە علیە وسلم، ئەوە طاغوتە.

تاغوتەکان زۆرن سەرکردەکانیشیان پێنجن :-

**یەکەم:**

شەیطان : بانگخواز بۆ پەرستنی جگە لە اللە، بەڵگەش فەرموودەی اللە تعالی:

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾[٤٤] واتە: خوای گەورە گلەیی لە یاخیەکانی نەوەی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم، مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە.

**دووەم:**

فەرمانڕەوایەکی ستەمکار کە حوکمی اللە تعالی ی گۆڕیوە، بەڵگەش فەرموودەی اللە تعالی:

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾[٤٥] واتە: ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لافی ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت ڕووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا

بـە ڕاسـتی فـەرمانیان پێـدراوە کـە باوەڕیـان بـە (تـاغوت) نـەبێت، شـەیتانیش دەیـەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێ سنوور.

**سێیەم:**

فەرمـان ڕەوایەك کە فەرمـان و دەسـەڵات داری بکـات بەبەرنـامەیەك جـگە لەوەی خـوا کە دای بەزاندوە. بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:

﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾[٤٦] واتە: وا ئـەوەی حـوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئاەوانە بێ باوەڕن.

**چوارەم:**

هەرکەسـێک بـانگەوازی ئەوە بکـات کە لە عـیلم الغیـب دەزانێـت جـگە لە الـلە، بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:

﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا (٢٦) إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا ﴾[٤٧] واتە: ئـەو زاتـە زانـای نهێنـی و شـاراوەکانە، کەسـیش لـە نهێنـی و شـاراوەکانی ئاگـادار ناکـات. مەگـەر بـۆ پێغەمبـەرێك خـوا خـۆی ڕازی بێـت (بـەوەی هەنـدێ نهێنـی بزانێـت)، ئـەوکاتـە فریشـتە دەکاتـە پاسـەوانی لـە بەرو پشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێ بەرن)...

وە دەفەرموێت :

﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾[٤٨]واتە: کلیلـی هـەموو شـاراوەکان و زانینـی هـەموو نهێنیـەکان بەدەسـت خوایـە و هـەر لای ئـەوە، کـەس نایانزانێـت جگـە لـەو زاتـە هـەرچی لەسـەر وشـکانیە (لـە گیانـدارو بـێ گیـان و گیـاو دارو زینـدەوەرانی وردو درشـت لەسـەر زەوی و لـە تـوێی خاکـدا) خـوا پێـی دەزانێـت، هـەروەها هـەرچی لـە دەریاکانیشـدا هەیـە (لـە زینـدەوەری هەمـەجۆرو ماسـی سـەیرو سـەمەرە) ئاگـای لێیـەتی و هـیچ گەڵایـەک ناکەوێتـە خـوارەوە خـوا پێـی نـەزانێت، هـەروەها دەنکێـک یـان تۆوێـک لـە تاریکیـەکانی زەویـدا نیـە، ئـەو دەنکـە چ شـێدار بێـت یـان وشـک بێـت، هـیچ شـتێک نیـە لـە خـوا پـەنهان بێـت و لـە (لـوح المحفـوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتیدا تۆمار نەکرابێت.

**پێنجەم:**

ئەوکەسـەی کە دەپەرسـترێت جـگە لە اللـە و خۆیشـی بەو پەرستنـە ڕازیـە، بەڵگەشـ فەرموودەی الله تعالی:

﴿ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾

[٤٩]واتە: خـۆ ئەگـەر یـەکێک لـە فریشـتەکان (لـە خـۆی غـەرڕا بێـت) بڵێـت: بەڕاسـتی منـیش خـوام بێجگـە لـەو، ئـەوە پاداشـتی دەدەینـەوە بـە دۆزەخ، هـەر بـەو شـێوەیە پاداشتی ستەمکاران و یاخیەکان دەدەینەوە.

*وه ئـەوه بـاش بـزانه كه مـرۆڤ نـابێته بـڕواداری تەواو به اللـه مەگەر (إلا) به كـوفر كردن به تاغووت نەبێت، بەڵگەش فەرمودەی الله تعالی:

﴿ فَمَـن يَكْفُـرْ بِالطَّـاغُوتِ وَيُـؤْمِن بِاللَّـهِ فَقَـدِ اسْتَمْسَـكَ بِـالْعُرْوَةِ الْـوُثْقَىٰ لَا انفِصَـامَ لَهَـا ۗ وَاللَّـهُ سَـمِيعٌ عَلِـيمٌ ﴾[٥٠] واته: جـا ئەوەی بـاوەڕی نەبێـت به . طـاغوت . (كه بـريتيیه له : هەمـوو ڕێـگه و ڕێبـاز و هێـز و بەرنـامه و لادان و بتێـك) و بـاوەڕی دامەزراو بهێنێـت به خـوا، جـا بێگومـان ئەوكەسـه دەسـتی گرتـووه به بەهێزتـرین هۆكـاری ڕزگـاریەوە، شـوێن دامەزراوتـرین بیـرو بـاوەڕ كەوتـووە، كه هـیچ پسـان و هەڵوەشـانەوەیەكی بـۆ نیـیه و هەمیشه پته و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەر و زانایه.

(الرشد) : ئاینی محمده . ﷺ . , وه( الغي) یش ئاینەكەی ابو جَهله،

( العـروة الـوثقی) یـش شـاهیدی دانه كه هـیچ خـودایەك نیـیه شایسـتەی پەرسـتن بێـت به حەق جگه له الله .. كه ئەوەشـ پێكـدێت له نەرێ كـردن و جێگیـر كـردن)(ـ نـەرێ . دەكـات به هەر جـۆره پەرەسـتنێك جـگه له اللـه، وه هەمـوو جـۆره پەرەستنـەكانیش جێگیر دەكات بۆ الله به تاك و تەنها هیچ هاوەڵێكی نییه.

والحَمـْدُلِله الَّذي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحاتِ

## شوێن ئایەتەکان لە قورئان

1. [ محمد : 19 ]
2. [ زخرف : 86 ]
3. [ الحجراد : 15 ]
4. [ زمر : 3 ]
5. [ البينة : 5 ]
6. [ عنكبوت : 2-3 ]
7. [ البقره : 8-10 ]
8. [ البقره : 165]
9. [ المائدة : 54 ]
10. [ الزمر : 54 ]
11. [ النساء : 125]
12. [ اللقمان : 22 ]
13. [ النساء : 65 ]
14. [ الزخـــــرف : 25- 23 ]
15. [ الصـــــافات : 36- 35 ]
16. [ النساء : 48 ]
17. [ المائدة : 72 ]
18. [ التوبة : 66-65 ]
19. [ البقرة : 102 ]
20. [ المائدة :51 ]
21. [ السجدة : 22 ]
22. [ يونس : 31 ]
23. [ الاخلاص ]
24. [ الاعراف : 180 ]
25. [ النساء : 116]
26. [ الشورى : 11 ]
27. [ المائدة : 72 ]
28. [ الفرقان : 23 ]
29. [ الزمر : 65 ]
30. [ الانعام : 88 ]
31. [ العنكبـــــوت : 65 ]
32. [ هود : 15 ]
33. [ التوبه :31 ]
34. [ البقره : 165 ]
35. [ الكهف : 110 ]
36. [ العنكبـــــوت : 68 ]
37. [ البقرة : 34 ]
38. [ الكهف : 35 ]
39. [ الاحقاف : 3 ]
40. [ المنافقون : 3 ]
41. [ النحل : 112 ]
42. [ النحل : 36 ]
43. [ الممتحنه : 4 ]
44. [ يس : 60 ]
45. [ النساء : 60 ]
46. [ المائده : 44 ]
47. [ الجن : 27 ]
48. [ الانعام : 59 ]
49. [ الانبياء : 29 ]
50. [ البقره : 265 ]

